2018

# گەیشتن بە سەربەخۆیی دارایی



## برایان تریسی

و: ئاگری ئەفشین

من زۆر هۆگری ئەم بابەتەم چونکە دەزانم کە گەیشتن بە سەربەخۆیەی دارایی مەحاڵ نییە و دڵنیام کە هەموو ئێوەش دەتوانن بگەن بە سەربەخۆیەکی لەم جۆرە. (برایان تریسی)



# بە ئارامی بگەن بە ئارەزووەکانتان

1_ لە سەردەمی ئەمڕۆ لە چاو هەر سەردەمێکی تر لە مێژوودا کەسانێکی زیاتر توانیویانە بگەن بە سەربەخۆیی دارایی یان لە حاڵەتی گەیشتنن بە سەربەخۆیی، زۆر کەس ئاگاداری ئەم بابەتە نین بەڵام ئێمە لە سەردەمی زێڕینی مێژوودا دەژین؛ ئێمە لە باشترین و گەروەترین سەردەمی مێژوو لە دایك بووینە و دەژین؛ هەرگیز لە هیچ سەردەمێك شتی وا نەبوو کە ڕێژەیەکی یەکجار زۆری کۆمەڵگا توانیبێتیان لە ڕێگەی تەجرەبە و خوێندەواری بتوانن دەوڵەمەند بن، لە ڕابردوو سەروەت و سامان هەمیشە لە ژێر دەستی گروپێکی دیاریکراو بووە و باقی خەڵکی کومەڵگا دەستیان نەگەیشتووە بەم سەروەتە؛ لە ڕاستیدا دەبێ بڵێم کە هیچ هۆکارو بەهانەیەك نییە کە تۆ نەتوانی بەم سەربەخۆییە بگەی، لەبەر ئەوەی تۆ ئەهلی موتاڵا کردن و خوێندەواریت و ئەمەش یانی کە تۆ لە پێشتری لە چاو باقی خەڵکی دیکەی کۆمەڵگا، ئەم لە پێشتر بوونە دەبێتە هۆی ئەوەی کە تۆ یەکێك بیت لە باشترینەکانی دونیا و بە باشی ئەوەش دەزانی کە کەمتر خەڵك پەیدا دەبێ کە ئەم ڕاستی و تەکنیکانە بزانێ، ئێستا ئەم لە پێشتر بوونە چۆن کەڵکی لێ وەردەگری، پەیوەستە بە خۆتەوە. ( ئادام سمیس لە کتێبی سەرمایەی گەلان، لەبارەی پاشەکەوت کردن تیوریەکی هەیە کە بە پێی ئەو تێوریە زۆر گرنگی بە پاشەکەوت کردن دەدا بەڵام ئەو پێی وایە تەنها سەرمایەدار و خاوەن زەویەکان دەتوانن پاشەکەوت بکەن؛ گەرچی تیۆری پاشەکەوت کردنی ئادام سمیس ئەرێنیە بەڵام لە ڕۆژگاری ئەمڕۆ ڕەخنە لەم تیۆریە دەگیری ئەوەش لەبەر ئەوەیە پێیان وایە تەنها سەرمایەدارو خاوەن زەویەکان نین دەتوانن پاشەکەوت بکەن بەڵکو هەموو کەسێك دەتوانێ ئەو کارە بکات هەتا کرێکارێکی سادەش. ئاگری.)

له ساڵی 1900 نزیکەی پێنج ملیاردێری گەورە هەبوون، لە ساڵی 1950 ئەم ژمارەیە گەشتە سەد هەزار نەفەر و تا بەر لە ساڵی 1960 گەشتە 200 هەزار نەفەر و دواتر لە ساڵی 1970 گەشتە 300 هەزار بەڵام لە ناکاو ئەم ڕێژەیە زۆر بە خێرای بازێکی گەورەی دا ئەوەبوو کە لە ساڵی 1980 نزیکەی یەك ملیۆن و هەشت سەد هەزار ملیاردێر پەیدا بوون، ئەمە خۆی لە خۆیدا تەقینەوەیەکی گەورە بوو، تا ساڵی 1996 گەشتە سێ ملیۆن و حەوسەت نەفەر، بەم بەرزبوونەوەی ڕێژەیە دەکرێ بڵێین کە لە هەر 8 دەقیقەیەك یەك کەس دەبووە ملیاردێر و ئەمرۆش تەقریبەن لە هەر 4.5 دەقیقە کەسێك دەبێتە ملیلردێر و ئەمەش هەرگیز مێژوو شتی وای بە خۆیەوە نەدیوە. و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ژمارەیەکی زیاتر و زیاتر دەتوانن بەم ئاستە بگەن، هەر چەند لەوانەیە ئەمرۆ ملیاردێر بوون وەك پێشتر گرنگ نەبێت، بەڵام بەشی ئەوەندە گرنگە کە ئەگەر سێ ملیارد دینارت هەبێت ئیتر مەجبوور نیت بوەستیت.



**2_ یاساکانی گەیشتن بە سەربەخۆیی دارایی زۆر سادەن:**

ئا: هەمیشە کەمتر لە داهاتەکەت خەرج بکەو باقیەکەی پاشەکەوت بکە؛ ئەمە خۆی هەمان لە پێشتربوونە؛ یەك کەسی زۆر ئاسایی و کارێکی سادەشی هەبێت یان کارێکی مامناوەندی هەبێت، بۆ نموونە کرێکارێکی بەنزینخانە، کرێکاری خانوو دروست کردن یان شۆفیری تەراکتۆر یان یەك مەلوان کە لە سەر کەشتی کار دەکات دەتوانێ ببێتە ملیۆنێر؛ تەنها لە ماوەی چل ساڵی تەمەنی کارکردنی و بە پاشکەوت کردنی سێسەد هەزار دینار مانگانە، واتە 75000 لە هەفتەیەك و تەقریبەن دە هەزار و حەوست دینار لە ڕۆژێکدا.

هەر کارێکی دیکە پێتان خۆشە ئەنجامی بدەن بەڵام ئەم کارەش (پاشەکەوت کردن) ئەنجام بدەن.

بێ: 10٪ لە هەر هەزار دینارێك بۆ پاشـــەکەوت کردنە: مانای ئەم ڕســـتەیە ئەوەیە کە دەبێ هەندێ عادەت و ڕەفتار لە خۆتدا وەدیبێنی کە چـاوپۆشـی بکەی لە 10٪ لە تەواوی داهاتەکەتان و دەبێ پشـت بە 90٪ دەکەی دیکە ببەسـتیت: بۆ نموونە ئەگەر مانگی سـێ ملیۆن دینار داهاتت هەیە، وادابنێ کە تۆ دوو ملیۆن و حەوسـەد هەزار دینار داهاتت هەیە؛ زۆربەی کات خەڵك موچەکانیان وەردەگرن و خەرجی دەکەن، دواتر ئەگەر شتێکی بۆ مابێتەوە و ئەگەر ئەو کەسانە فکرێکی ئاینده بینیان هەبێ دەچن پارەکەیان لە بانك دادەنێن و دوای ماوەیەکی کەم دەچـــن پارەکەیان لە بانك دەردێنن و لە شـــوێنێکی تر خەرجی دەکەن، زۆر جار کاتێك چـــاو لە ژمارە حیســـابەکەیان دەکەن دەڵێن، شـــکور خوایە ئەوە پارەی تێدایە با بڕۆم خەرجی کەم!! زۆربەی خەڵك ئەم خەســڵەتەیان هەیە و زۆربەیان وەك منداڵ وان، یانی دەڵێی ماری لە گیرفانی دایە و دیهەوێ هەرچـــی زووە لە کۆڵ خۆی کاتەوە.

ج: کەوابوو پاشەکەوت کردنی 300 هەزار دینار مانگانە دەتوانێ بتکاتە ملیۆنێر

د: گەیشــتن بە ســەربەخۆیی دارایی وەکوو پۆســت یا پلەیەکی بەرز چـاو لێ بکە: بە خۆت بڵێ کە یەکەم جار ســـەربەخۆ بوون دواتر پۆســـت و مەقام یا متمانە، ئەمە ڕاســـتیکی ســـەیرە بۆ ئەوە دەبێت مرۆڤ لێی بفکرێ.

ئێســـتا با ڕاســـتیەك لە بارەی ملیاردێرە ســـەرکەوتوەکانەوە باس بکەم: هیچ ملیاردێرێك ئۆتۆمبیلی ســـفر کیلۆمەتری ئاخیر مۆدێل ناکڕێ، لەبەر ئەوەی سەیارەی سفر کیلۆمەتر چەندین ملیۆن لە نرخەکەی دادەبەزێ، کەوابوو ئەوان ئەو سـەیارەی خۆشـیان لێ دێ پەیدای دەکەن، بە جوانی لێی ووردەبنەوە بۆ ئەوەی ئاگادار بنەوە لە بارەی پێشـینەی ئەم سـەیارەوە کە ئایا چاککراوەتەوە یان نا، و دواتر دوای دوو تا سـێ سـاڵ دەچـنەوە بازاڕ و چاوێك دەگێڕن بە ماشێنە مۆدێل نوێیەکانی ناو بازاڕ و دووبارە سەیارەیەکی خاوێنی دەستە دوو دەکڕن کە زۆر نەڕۆشـتبێ و دووبارە چـەند سـاڵ سـواری ئەم سـەیارە دەبن و هیچ کات بۆشـیان گرینگ نیە کە سـەیارەکە سـفر کیلۆمەترە یان نا.

من ماوەیەك ڕاوێژکاری کەسێك بووم کە 800 ملیۆن دۆلار سەرمایەی هەبوو، ماڵەکەی لە شوێنێکی خۆش بوو، بەڵام هاوســێکانی ئەگەر دوو مانگ موچـــەکانیان دوا کەوتبا نەیاندەتوانی قەرزی خانوو یان کرێی خانوەکانیان بدەن، لە حاڵێکدا ئەو 800 ملیۆن دۆلار پارەی هەبوو، ئەو سـەیارەیەکی کادیلایکی مۆدێل بەرزی هەبوو و دوای سـی یان چـوار سـاڵ ئەم سـەیارەی گۆڕیەوە بە سـەیارەیەکی دیکەی دەسـتە دووی خاوین، هەرگیز ئەو چـاوی لە ڕووکەشـی شـتەکان نەبوو، وێڵ خەرجی نەدەکرد، ئەمە لە هەمان کاتدا سـواری ماشـێنی خراپیش نەدەبوو، کەم کەم ئەم پیاوە بوو بە یەکێك لە دەوڵەمەندە زلەکانی ئەمریکا لە کاتێکدا قەد و قەیافەو ڕووکەشێکی زۆر سادەو خاکیشی هەبوو.

ھ: ھەر کاتێك بڕە پارەیەکت پاشـــەکەوت کرد ئیتر دەســـتی لێ مەدە: زۆرێك لە مە ئەم ھەڵەیە دەکەین، وابیر دەکەینەوە کە ئەگەر بڕە پارەیەکمان جەم کرد بۆمان ھەیە ھەر کات بمان ھەوێ بە کاری بھێنین، وەك ئەوەی بڵێی ئەم پارەیەمان بۆ ســـەیران و گەشـــت و گوزار وەلاناوە، کاتێك پارەیەك دەخەینە بانك ھەمیشـــە لە فکری ئەوەین کە خەرجی بکەین، دەمھەوێ ســـەیارەیەك بکڕم، دەمھەوێ بەلەمێك بکڕم، خانوو بکڕم، ماتۆرســـیکلێك بکڕم، فلان موبایلە جوانە یان فلان لاپتۆپ مۆدێلی نوێیە و ھەزارو یەك شتی دیکە، یەکسەر دەچینە گیانی ئەو پارەیەی وەلامان ناوە؛ ئەگەر دەتھەوێ پارەکەت بۆ ئەم شتانە بەکار بھێنیت واباشترە ژمارە حیسابێك بە جیا بۆ ئەم شـــتانە بکەیتەوە، بەڵام ئەمە پاشـــەکەوتێکە بۆ ئەمنیەتی دارایی ئێوە، واتە کاتێك پارەتان خســـتە ئەم حسابەوە و قوفڵی بدە وەکوو سندوقی پۆستی کە دەتوانی نامەی تێخەی بەڵام ناتوانی نامەی لێ دەربێنی.

ھیچ کاتێك گرنگی بەم پارەیە مدەن و خەرجی مەکەن، دەتوانم باس لەوە بکەم کە ئەم کارە تا چـــەند دەتوانێ گۆڕانکاری بخاتە ژیانی ئێوەوە، بەڵام جارێ تکایە ئەوەی دەیڵێم بە قســـەم بکەن و کاتێك پارەیەکتان پاشـەکەوت کرد بڕیار بدە کە ھەرگیز خەرجی نەکەی، وای دابنێ ئەم پارەیە ئاو بردی و نەماوە، بە خۆتان بڵێن من ئەم پارەیە خەرج ناکەم، ھەر کارێك بێت دەیکەم ھەتا ئەگەر زۆر زەروریش بێت من دەســـت لەم پارەیە نادەم، ھەتا بیریشی لێ مەکەنەوە، بۆنموونە ئەگەر بیری لێ بکەیەوە بڵێی من ئێستا ئەم پارەیە پاشەکەوت دەکەم بەڵام ھەر وەخت ویستم خەرجی دەکەم دڵنیا بە ھەر زۆر زوو ئەو پارەیە خەرج دەکرێ، لەبەر ئەوەی کاریگەری زھنی ئەم کارە زۆر زیاترە لە نرخی دارایی ئەو پارەیەی کە پاشەکەوت کراوە.

### 3_ ڕێز لە پارە بگرە:

پارە لە خۆیدا شەخسیەتێکی ھەیە، بە تایبەت ئەو پارەیەی کە لە ڕێگای دروستەوە بە دەست ھاتبێت، کەوابوو پارە ناچێتە ھەموو شوێنێك، تەنھا دەچێتە ئەو شوێنەی کە ڕێزی لێ بگرن و لە شوێنێك نامێنێتەوە کە قەدری نەزان؛ کەوابوو پارە دەچێتە شوێنێك کە گرنگی پێ بدرێ و خۆشیان بوێ.

ئێســـتا بۆ ئەوەی بزانی تۆ تا چـــەند پارەت بە لاوە گرینگە یاخود چ نرخێکی بۆ دادەنێی ڕێگەیەك ھەیە خۆت تاقی بکەیەوە، تەماشـــا بکە بزانە چـــۆن ڕەفتار لە گەڵ ئەو پارەیە دەکەی کە ئێســـتا ھەتە، ئەگەر ئەو پارە و پوڵەی ھەتە لە کیفی پارەکەت دا وەکوو ھەر کاغەزێکی دیکەی بێ نرخ تەماشـــای بکەی و ھەروا بە شـــپرزەی و لول کراوی لە گیرفانت ناوە، ئەوە بزانە ئەم کارەی جەنابتان ئەوەندەش لە جێی خۆی نییە، ئەگەر چەند دەستە چەکەت ھەبێ و نازانی ھەر چەکێکت بۆ کام جۆرە کەسێکە و ھەرگیز نەزانن لە حیسابە بانکیەکانت چەندە پارەت ھەیە، ئەوە ئەو کاتە دیار دەکەوێ کە نرخی پۆڵ نازانی، ئەگەر فاکتۆری کارەبا و ئاو تەلەفۆن ئەم شتانەت بۆ دێ، بەر لەوەی ئەم فاکتۆرانە بێن نەزانی دەبێ چەند پارە بۆ ئەم شتانە وەلا بنێی... ھەموو ئەمانە مانای ئەوەیە کە ڕێز لە پارە ناگری و کاتێکیش ڕێز لە پارە نەگری ئەو پارەیە دێت بەڵام زۆر نامێنێتەوە، تەنھا دێت ســـەرێکت لێدەوا و دەڕوا، لەبەر ئەوە کەســـانێك کە زۆر ڕێز لە پارە دەگرن بە وردی حیســـابەکانی خۆیان

دەپشكنن و ڕاستەو پاستەی دەكەن، دەستە چەكەكانیان كۆنترۆڵ دەكەن، پارەكانیان بە جوانی و ڕێك وپێك قەد دەكەن و دەیخەنە كیفی پارەكانیان. سكە و زێڕ و ئەو شتانە دەخەنە ناو قوتویەك یان بۆكسێكی تایبەت و لە شوێنێكی چاك هەڵی دەگرن، ئەو كەسانەی لە ڕووی دارایەوە نەزمیان هەیە هەمیشە دەوڵەمەندن و زیاتر پارە بۆ لای خۆیان ڕادەكێشن.

ئا: زۆرچاكە ئێستا ئەگەر زانیوتە تۆش زۆر ڕێز لە پارە ناگری دەبێ لە كوێڕا دەست پێ بكەیت؟ بڕیار بدە، لەمەو لا بە خۆت بڵێی كە دەبێ بەرنامە دارایەكانی خۆت ڕێ و پێك بكەیت، بە خۆت بڵێ كە ئەگەر هەفتەیەك یان مانگێكیش وەخت بەرێت دەبێ من دانیشم و هەموو بابەتە دارایەكانی خۆم ڕاستەو پاستە بكەم، بڵێ دەبێ تا فلسی ئاخیر دارایەكانم ئەژمار بكەم، دەبێ بۆجەو خەرجی هەموو شتەكانت لە بەر دەستدا بێت، دەبێ داهاتەكەت بەراوەرد بكەیت لە گەڵ خەرجیەكەت، دەبێ بزانی خەرجیەكانی ڕۆژانەت چنە، كامیان جێگیرە و كامیان ناجێگیرە؟ كامیان دەبێ وەلا بنێم، كامیان گرنگترە؟ بە جۆرێكی تر ئەگەر بڵێم: كاتێك تۆ دەست دەبەی بە تاوتوێ كردنی بەرنامەی دارایی خۆت ئەوا بارودۆخی دارایی تۆ گۆڕانی بە سەر دێت.

تەكنیكێكی سادەو لە هەمان كات زۆر كاریگەر بۆ ئەم بابەتە ئەوەیە: هەمیشە دەفەتەرێكت پێ بێت و هەر شتێك لە ماوەی هەفتەیەك خەرجی دەكەی لەو دەفتەرە بینوسەوە، سرنج بدە هەتا ئەوانەش بنوسەوە كە هەر تاكێكی خێزانەكەت خەرجی دەكەن، بۆنموونە بنووسە چوار هەزار دینار خەرجی پۆست و 250 دینار كۆلا... و دڵنیا بە كە ئەم كارە دید و فەلسەفەی تۆ سەبارەت بە پارە دەگۆڕێ، كاتێك خەرجیەكان وەكوو لیستێك دەنوسیەوە و گرنگیان پێ بدەی و كەم كەم دەست بكە بە شیكاری بۆ خەرجیەكان، ئەو كات شتێكی گرنگ و نائاسایت بۆ دەردەكەوێت، بۆت دەردەكەوێت پێشتر هەندێ خەرجیت كردووە كە هیچ پێویست نەبووە و ئەو كات دەتوانی فكرێكیان بۆ بكەیتەوە و بارودۆخی دارایت ڕێكخراوتر دەبێت.

بێ: هەمان ئەو وەختەی بۆ بە دەست هێنانی پارە بە كاری دەهێنی ئەوەندە وەختەش بەكار بهێنە بۆ تاوتوێ كردنی سارمایەگوزاری؛ هەندێ جار كەسانێك دەبینی زۆر بە ناوازەی پارە پاشەكەوت دەكەن و زۆر بە باشی ئاگایان لە پارە دەبێت و كۆی دەكەنەوە، بەڵام هاوكات دەگەڵ ئەوەی كە ئەگەر پێشنیاریەكی سەرمایەگوزاریان پێ بكرێت خێرا و بە بێ بیر كردنەوە پەسەندی دەكەن، بە فڕكانێك بە بێ ئەوەی هیچ شارەزایەكیان لەو كارە هەبێ دەچن سەمایەگوزاری دەكەن، هەر ئەوەندە بەسە تەنها پێیان بڵێی من كۆمپانیایەكم هەیە ئەوا یەكسەر دەستەپاچە دەبن و پارەكەیان دەخەنە سەرمایەگوزاریەوە، یان ئەوەندە پێیان بڵێی بورسیەم بۆ سەرمایەگوزاری خراپ نییە، خێرا دەست لە گیرفانیان ئەكەن و هەرچیان هەیە خەرجی دەكەن؛ بۆ من بە ڕاستی زۆر سەیرە كە ئەم كەسانە چۆن بە چی خێرایەك پارەكانیان دەخەنە بەردەستی كەسانی دیكە.

ئەمڕۆ ئەمریكا بە تەواوی كڵاوچیەتی و فێڵبازی دایپۆشیوە، بە خاتری ئەو جۆراوجۆریەتیەی لە ئابوری كە لە ئەمریكا هەیە، فێڵبازەكان وەكوو گیا لە زەوی سەوز دەبن و دەزانی سەرەكی ترین ئامرازی دەستی ئەو كەسانە

چــــیە؟ تەلەفوون، بەڵێ تەلەفوون، لەوانەیە ئەم تەلەفونانەش بۆ تۆ کرابێ کە دەڵێن: ئێمە فلان کاڵات بۆ دەنێرین و فلان ســـوودی هەیە و هەزار و یەك وەســـفی لەو جۆرەت بۆ دەکەن؛ لە بیرتان بێت کە هیچ کات لەم جۆرە کەسانە شت مەکڕن و هیچ کات لە پشت تەلەفونەوە لە گەڵ کەسێکی تر مەبە شەریك و لە هیچ کارێك سەرمایە گوزاری مەکەن تەنها لە پشت تەلەفونەوە، قسەیەکی مەشهور هەیە کە دەڵێ: ئاسانترین شت لە بارەی پوڵ لە دەستدانیەتی.

پارە پەیا کردن سەختە و کۆکردنەوەشی سەختە بەڵام لە دەستدانی ئاسانە. قسەیەکی ژاپۆنی هەیە کە دەڵێ: پارە پەیدا کردن وەکوو هەڵکەندنی چاڵە لە سەر لم بە دەرزی بەڵام لە دەستدانی پارە وەکوو ڕژاندنی ئاوە بە سەر لمدا، کەوابوو ئاگاداربن تەقریبەن هەر شتێك کە لە چوار دەورتانن تەڵەیە بۆ خەرج کردن یان لە دەستدانی پارە.

ج: پێداچـــونەوە بۆ بچـــوکترین بابەتی بازرگانی بکە، ئەو هاوڕێیەی کە لە بارەیەوە قســـەم بۆ کردن ئەوەی کە 800 ملیۆن دۆلاری هەبوو، لە بیرتانە؟ کەم کەســـم دیوە وەك ئەو پیاوە بێت کە وەختێکی چـــاك بە کاربهێنێت بۆ بڕیاردان و ســـەرمایەگوزاری کردن بە وەســـواسی و زۆر بە دیقەتەوە، ئەو هەتا تاوتوێی بچـــوکترین بەشی بازرگانی دەکرد و هەرچـــەند ڕێژەی ســـەرمایەگوزاریەکە زیاتر بوایە ئەو زیاترووردبین تر دەبوو و هەموو وەردەکاریەکانی ئەو کارەی لە بەر چـــاو دەگرت، جارێك پێشـــنیاری ســـەرمایەگوزاریان پێدا لە کانەکانی مۆلیبیدیۆم، ئەویش دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لە سەر مۆلبیدیۆم و هەرچی زانیاری هەبوو هەڵی سەنگاند لە بارەی نرخ، گۆڕانی نرخ، ڕێژەی داواکاری بازاری جیهانی بۆ ئەم کانزایە، خەرجیەکانی دەرهێنان و گواســـتنەوە، خەرجیەکانی کەرەستەی دەرهێنانی ئەو کانزایە لە ژێر زەوی، بازاڕی ئەم کانزایە لە پەنجا ساڵی ڕابردوو چۆن بووە هەموو ئەمانەی تاوتوێ کرد و لە کۆتاییدا بڕیاری دا کە پەنجا ملیۆن لە سامانەکەی بخاتە سەرمایەگوزاری کردن لە سەر مۆلبیدیۆم، تۆ لە بارەی مۆلیبیدیۆمەوە چی دەزانی، من خۆم هیچی لە بارەوە نازانم.

ئەم کانە تەنها یەکێك بوو لە 200 بابەت کە ئەو پیاوە تێیدا ســـەرمایەگوزاری کردبوو، ئەو زیاتر لەوەی کە پێشـــبینی بکەی لە بارەی مۆلیبیدیۆمەوە زانیاری هەبوو، پرســـیاری زۆر وورد و زیرەکانەی لە بارەی مولیبیدیۆمەوە دروســـت دەکرد، کاتێك کاری کانەکە تەواو بوو تەقریبەن 150 ملیۆن قازانجی کردبوو، تەنها لە سەرمایەگوزاری کردن لە کانی مولبیدیۆم، لەبەر ئەوەی بە باشی لە بارەی ئەم کانزایەوە زانیاری هەبوو و باوەڕ بکە هیچ کەس زاتی ئەوەی نەبوو هەتا بیر لەوە بکاتەوە کە فێڵ لەم پیاوە بکات لەم بارەیەوە.



**د: له گەڵ ئەو کەسانە سەرمایەگوزاری بکەن کە کارزانن و پێشینەی سەرکەوتوویان هەیە، هەروەها لە گەڵ کەسە لێهاتووەکان شەریکی بکەن؛ یەکێك لە هاوڕێ ملیاردێرەکانم بۆی باس دەکردم و دەیووت: "جارێك کەسێك لە شەریکەیەکی ناودار هاتە لام و ووتی ئێمە پێشنیاری سەرمایەگەزاریەکی باشت پێ دەکەین و من پێم خۆشە ببمە ڕاوێژکاری تۆ لەم بارەیەوە، منیش پێم ووت: زۆر باشە، زۆر باشە ئافەرین، بەڵام ڕاپۆرتێك لە سەر دارایەکانی خۆتم بۆ بنێرە." بینیت؟ هەر ئاوا پێی گووت ئەگەر تۆ دەتهەوێ بارودۆخی دارایی من بزانی کەوابوو منیش دەمهەوێ بارودۆخی دارایی تۆ بزانم، ئەگەر دەتهەوێ بە پارەی من سەرمایەگوزاری بکەیت منیش دەمهەوێ لە بارەی بارودۆخی دارایی و پێشینەی کاری تۆ بزانم؛ بۆچی؟ لەبەر ئەوەی دەمهەوێ دڵنیا بمەوە لەوەی کە تۆ لە من باشتر دەتوانی بڕیار لە سەر سەرمایە گوزاری بدەی، تۆ کە ئەوەندە سەرکەوتووبویە لە بڕیاری دارایی و بارودۆخت ئەوەندە باشە هاتووی پێشنیاری سەرمایەگوزاری بە من دەکەی، کەوابوو دەبێ زۆر لە من باشتر بیت، کەوابوو تکایە ڕاپۆرتێکم لەسەر بارودۆخی داراییساڵی ڕابردوو بۆ بنێرە، بەم جۆرە پەیگیریە پێت وایە چەند کەس لەو فێڵبازانە لە ڕێگای تەلەفونەوە پێشنیاری سەرمایەگوزاریتان پێ دەدەن؟ ئەگەر کەسێك پیشنیاری سەرمایە گوزاریان پێ دای پێیان بڵێ زۆر باشە بەڵام دەکرێ منیش لە بارەی وەزعی دارایی تۆوە بزانم؟ تۆ داوای پارە لە من دەکەی منیش دەبێ لە بارەی دارایی تۆ بزانم، ئەوە بزانم کە تۆ پێشتر دارایی و سامانی خۆت لە بازرگانی چلۆن بەکارهێناوە و هیچ کێشەیەکی تێدانییە کە ئەم داوایە لە کەسی بەرامبەر بکەیت، دڵنیا بە ئەو کەسانەی نایانهەوێ ئەو زانیاریانە بخەنە بەردەستتان، فێڵێکیان لەبن سەرە، ئەم جۆرە کەسانە هەزار و یەك بەهانە دێننەوە دواتر ئیتر سۆراغت ناگرنەوە، بەڵام هەر کاتێك کەسانێکت تۆش بوون کە ئەوانیش هەموو زانیاریەکیان لە بارەی دارایی خۆیانەوە خستە بەردەستت و زانیت پێشینەی چاکیان هەیە دڵنیا بە کە بژاردەیەکی چاکە؛ ئەگەر سەرمایە گوزاری بۆ ئەم کەسانە بکەن ڕێك لە هەدەفت داوە.**

و: ملیۆنێره ســـەركەوتووەكان هەرگیز قومار ناكەن بە حەدس و گومان و شـــاید كارەكانیان نابەنە پێش، هیچ كارێك، هیچ كارێك لە ڕێگای شـانسـەوە ئەنجام نادەن؛ لە ڕاسـتیدا ملیۆنەرەكان حەسـاسـیەتیان بە قومار كردن هەیە؛ ئێستا ئەمە یانی چی؟ یانی ئەوەی ئەون لە دەست هەر شـتێك ڕا دەكەن كە بۆنی قوماری لێ بێت، وەك ئەوەی بڵێی لە ڕووی فكریەوە لە گەڵ قومار كردن كێشـەیان هەیە ئەویش لە بەر دوو هۆكار: هەوەڵ ئەوەی كە قومار واتە هەوڵدان بۆ بەدەسـت هێنانی شـتێك لە بەرامبەر هیچ، كە هەوڵێكی زۆر ناحەز وناشـیرینە و وەك شـێرپەنجەیە كە ئەگەر یەخەی هەر كۆمەڵگایەك بگرێت لە ناوی دەبا، هیچ شـەرع و یاسـایەك ئەم كارە بە پەسـەند نازانێت، دووهەم ئەم كەسانە دەیانهەوێ بە وردی حیسابی هەر خەتەرێك بكەن، هەوڵ دەدەن لە سـەر بنەمای حەسـاوێكی وورد و دەقیقی توانا و لێهاتویەكانی خۆیان كارەكان هەڵسـەنگێنن بەڵام بە هیچ شـێوەیەك پەیوەندیەكی باشیان لە گەڵ قومار كردن نییە، خۆشیان لە قومار كردن نایە.

هەندێ جار لەوانەیە لەم بارودۆخانە فكرێكی مەترسـیدار بە مێشـكی مرۆڤدا بێت، تا من توانیم ئەم فیكرە بناسـم چـەندین سـاڵ درێژەی كێشـا؛ كاتێك لە بەرامبەر هەر ریسـكێك( خەتەر كردن/دووبەخت)ی دارایی هەنگاوت نا بۆ ئەوەی شـتەكان بە ووردی بە حسـاو كردن بەریتە پێش بە ئەگەرێكی زۆر لە ڕوانگەی دارایەوە پێشـڕەویكی باش دەكەیت، لەم حاڵەتدا لەوانەیە ئەم بیرە بێت بی مێشـكی مرۆڤدا كە ئێمە دەتوانین ئەوەندە سـوود بكەین بۆچـی لە گەڵ ڕیسكێكی گەورەتر كار نەكەین؟ تا ئێسـتا بۆت پێش هاتووە ئەم بیرە بكەیتەوە؟ ئا لێرەیە كە ئەو خەتەرە دێتە پێشـەوە، ئەگەر كار بە فكرێكی ئاوا بكەی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر زەرەر دەكەیت و ڕێك وەكوو قوماربازێك تا ئاخرین فلس لە دەست دەدەیت، باوەڕكە هیچ كام لە ملیاردێره سەركەوتووەكان ڕێگە نادەن فكرێكی ئەوها بێت بە لایانا، یانی ئەوەی كە من توانیومە لە كارێك سـوود بە دەسـت بێنم كە ڕیسـكێكی كەمی هەبێت كەوابوو دەشـتوانم لە كارێك بە ڕێسـكێكی زیاتریش سـوود بكەم یاخود ئەگەر زەرەریش بكەم شـتێكی ئەوەندە زۆر نیە !! نەخێر، هەرگیز، هەرگیز بیری ئەوە نەكەن پارەی خۆتان لە دەست بدەن هەتا یەك فلسیش لە دەسـت مەدەن، كاری تۆ ئەوە نییە كە ڕیسـك بكەیت بەڵكوو تۆ دەبێت ئەو ڕیسـكە كەم بكەیتەوە و سـوود بە دەسـت بێنیت و سـوودیش ئەو كاتە بەدەسـت دێت كە ڕیسـك كەم بكرێتەوە، ئەگەر لە كارێك ئەگەری لە دەسـت دانی پارە هەیە ئەوا لەو كارە پەشیمان بەرەوە و خەتێكی سوور بە دەوری ئەو كارە بكێشە، یاسای ئێمە ئەوەیە هەرگیز هیچ پارەیەك لە دەست نەدەین!!

دوو یاسای سەرەكی هەیە بۆ باش ڕەفتار كردن لە گەڵ پارە:

یاسای یەكەم: پارە لە دەست نەدەین.

یاسای دووەم: هەر وەختێك گومان هاتە پێشەوە كە كارێك دروستە یان نا ئەوا بگەڕێنەوە بۆ یاسای یەكەم.

پارە لە دەست نەدەن لەبەر ئەوەی لە دەستدانی پارە زۆر ئاسانە بەڵام بەدەست هێنانی گەلێك دشوارە، ئاگاداربن هەر ئەوەی كە كەسێك وتی یەڵا وەرە ناو ئەم كارەوە یان بڕۆ لە فلان شوێنە سەرمایەگوزاری بكە، یەكسەر مل پێوە مەنێ، هیچ پەلە مەكە، من ئەم قسـەیە لە بازرگانێكی ملیۆنێرەوە فێر بووم، ئەو هیچ پارەیەكی بە من

نەدا بەڵام دەوڵەمەندی کردم، ئەو بە هۆی ئەوەی ئەم شـــتەی فێری من کرد دەوڵەمەندی کردم، هەمیشـــە دەیووت: برایان هیچ کات لە سـەرمایەگوزاری کردن پەلە مەکە، سـەرمایەگوزاری وەکوو پاسـی نەفەر هەڵگر وایە ئەویش لە ڕێگای سەرەکی کە هەمیشە پڕە لە خەڵك، هەمیشە پاسی زۆر هەیە لەو شوێنانە، ئەگەر سواری پاسی یەکەم نەبووی لە دوای ئەو پاسـێکی تریش دێت؛ ئەوە من چـوو بووم ببمە ڕاوێژکاری سـەرمایەگوزاری ئەو بە گیانی ناخێرم، کاتێك پرۆژەیەکم لە دیدی خۆمە پێ باش بوو، یەکســـەر دەمووت ئەمە باشـــە، یەڵا دەبێ پەلە بکەین نەوەکوو لە دەسـتمان بچـێ، دەتکوت ڕاویان ناوم، بەڵام ئەو زۆر بە ئارامی دەیگووت، نە ڕاوەسـتە با بیری لێ بکەمەوە، ئێسـتا پەلەی لێ مەکە، هەمیشـە دەیووت: برایان هەرگیز لە سـەرمایەگوزاری کردن عەجەلە مەکە لەبەر ئەوەی هەمیشـــە پاسـێکی دیکەش لە دوای ئەمە دێت، دەزانی چـی؟ لە ڕاسـتیدا ئەو لە سـەر حەق بوو هەڵبەت هەموو بڕیارەکانی دروست نەبوون بەڵام ژمارەی ئەو بڕیارە دروسـتانەی کە دەیگرتن زۆر زیاتر بوو لە بڕیارە هەڵەکانی، ئەو لە خاڵی سفرەوە دەستی پێ کردبوو، لە سەرەتایی ژیانی پزیشکێکی گشتی بوو لە گوندێك کاری دەکرد، کەم کەم ســـامانەکەی خۆی بەرز کردەوە بۆ 800 ملیۆن و بوو بو یەکێك لە دەوڵمەندەکانی دونیا هەر لە ڕێگای پاســای لە دەســت نەدانی پارەوە، ئەگەر لە ئەنجامی کارێك دڵنیا نیت، ئەگەر هەســتت کرد دەبێ پەلە بکەیت، خێرا پەشیمان بەوە، لێگەڕێ ئەم پاسەش بڕوا لەبەر ئەوەی مەوقعیەتێکی دیکەی سەرمایگوزاریت بۆ پێش دێت.

**4: سوود لە پاسای کۆکردنەوە وەربگرە بۆ دەوڵەمەند بوون:**

لە بیرتە وتم دەست بکەی بە پاشەکەوت کردنی دە دەرسەد لە داهاتەکەت؟ ڕاستە، دەبێ ئەم بڕە پارە پاشەکەوت بکەیت تا لە کۆتایدا لە ڕوانگەی داراییەوە سەربەخۆی بەدەست بێنیت، هەندێ ڕەخنەم لێدەگرن کە تۆ ئاگات لە بارودۆخی خەڵکی هەژار نییە، و واقیع بین نیت، دەزانی بۆچـــی؟ لەبەر ئەوەی ئەوان دەڵێن کە ئەگەر تۆ بارودۆخی دارایی منت زانیبا نەتدەگووت 20 دەرسەد یان 10 دەرسەد لە داهاتەکەت پاشەکەوت بکە؛ ناتوانی دە تا بیست دەرسەد لە داهاتەکات پاشەکەوت بکەی؟ بە دڵنیایەوە ئەگەر کەسێکی سادە و ڕووکەش بیت ناتوانیت، هەموو داهاتەکەت خەرج دەکەیت، لە ئاخیری مانگ قەرزداریش دەبیتەوەو هەمیشـــە دۆعا دەکەی کە لەوانەیە یانسیبێکت بۆ دەرچێت، یان لە باخچەیەك شوێنێك گەنجێك بدۆزیتەوە و بەم جۆرە لە قەرزەکانت خۆت ڕزگار بکەیت، بەم جۆرە نییە؟ ئەگەر کەسێکی ڕووکەشی و سادە بیت بەم جۆرەیە، من کاتێك دەڵێم 20٪ یان 10٪ لە داهاتەکەت پاشەکەوت بکە تا دەوڵەمەند بیت، تۆ تەنها وەکوو تیوریەك چاو لەم بابەتە دەکەی، "زۆرباشە برایان ئێستا ئەم تیۆریانە هەمووی چاکن ئەی کەی بچین بۆ کافتریا؟"

زۆرچاکە من ئێستا دەمهەوێ پێشنیارێکتان پێ بکەم کە دەتوانی ژیانتان ئاڵوگۆڕ پێ بکات، ئەوەڵ ئەوەتان لە بیر بیت کە ئەگەر ئاشقی شتێك بن ئەوا ناوچەیەکی پڕلە ووزە بە دەوری ئەو شتەدا دروست دەکەن، ئەم ناوچە پڕ لە ووزەیە تایبەتمەندیەکانی ئەو شتە بۆ خۆی ڕادەکێشێ (جەزبی دەکات)؛ خۆش ویستن خۆشەویستی دەهێنێ و تا کۆتایی... وەك دەڵێن پارە، پارە ڕادەکێشـــێ، ئەی ئەگەر هیچ پارەیەك نەبێت چـــی دەکەیت؟ لەم حاڵەتدا تۆ

هیچ سەرچاوەیەکی وزەت نییە، لە سەرەتادا دەبێ شتێك هەبێ، وەکوو سفر، ئەگەر سفر ملیۆن جاریش گەورەی بکەیەوە هەر سفرە بەڵام ئەگەر فلسێکیشت هەبێت بە هەزار ئەوەندە کردن دەبتە دینارێك.

لە کتێبی پیرۆز هاتووە کە دەڵێ ئەگەر ئەوانەی دارایەکانی خۆیان نەشارنەوە ئێمە زیاتریان دەدەینێ و ئەوانەشی خۆیان بە فەقیر و نەدار لە قەڵەمم دەدەن لە کاتێك دەوڵەمەندن ئەوا هەژار و هەژارتریان دەکەین! لە زمانی ئینگلیسی ووشەی talent بە واتای لێهاتووی دێت بەڵام ئەم ووشەیە لە ڕۆم و یۆنانی کۆن بە مانای پارە دێت، بەو مانایەی کە ئەگەر پارەت هەبێ و بە باشی پارێزگاری لێ بکەیت خوداوەند زیاتر و زیاترت دەداتێ، چونکە دەتوانی پارەیەکی زیاتر بۆ خۆت جەزب بکەیت بەڵام ئەو کەسانەی پارەیان نییە واتە لێهاتوویان نییە، ئەوەندەشی کە هەیانە لێیان دەستێندرێتەوە لەبەر ئەوە بڕیار بدەن کە سەربەخۆیی داراییتان هەبێ، ئارامتان هەبێ، واتە چاوەڕێی ئەوەت نەبێ کە بە یەك شەو هەموو خواستەکانت وەدی بێن، هەروەها هیچ کات چاوەڕێی ئەوە مەکە کە لەبەرامبەر هیچ، شتێك بەدەست بهێنیت، چاوەڕێی سەروەتێکی چاك و پاك و حەڵاڵت هەبێ، زۆرباشە ئێستا دەگەین بەو پێشنیارەی قەولم پێ دابوون، بەم جۆرە بیربکەوە من ناتوانم 10٪ لە داهاتەکەم پاشەکەوت بکەم بەڵام:

ئا: ئێستا بە نەخت دەتوانم 1٪ پاشەکەوت بکەم، ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی فیکری تۆ سەبارەت بە ژیان بە تەواوی گۆڕانی بەسەر بێت؛ تەنها ئەوەندە پێویستە کە بڕیار بدەی هەر چەندە توانیت هەتا یەك دەرسەدیش بێت لە داهاتەکەتان پاشەکەوت بکەن و ژیانتان لەسەر بنەمای ئەو 99٪ بگوزەرێنن؛ وادابنێ کەسێك یاخود هەر بڵێین خێزانێك بە هەموویان داهاتەکەیان سێ ملیۆن دینارە لە مانگدا؛ 1٪ لەو داهاتە دەکاتە 30 هەزار دینارلە مانگێك بۆ پا شەکەوت کردن واتە ڕۆژێ هەزار دینار، ئێستا بۆ خۆت بڵێ کە ئەگەر سێ ملیۆن دەرامەتی خێزانێك بێت ڕۆژی هەزار دینار زۆرە؟ ئەگەر سرنج بدەی تەنها کافیە کۆلایەك کەمتر بخۆیتەوە یان سیگارێك کەمتر بکێشیت، یان کەمێ خواردنی چەرەزات کەم بکەیتەوە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی بتوانی ڕۆژێ هەزار دینار پاشەکەوت بکەی، هەڵبەت ئەم کارە تایبەتمەندیەکی گرنگی دەوێ ئەویش پێی دەڵێن قوربانی دان، ئەگەر بتوانی قوربانی بدەی؛ ئەو کاتە دەتوانی ڕۆژێ هەزار دینار پاشەکەوت بکەیت، بەڵام بۆ ئەوەی کاریگەری ڕەوانی ئەم کارە تەواو بێت نابێ زەخیرەی 30 هەزاری ئەو مانگە دوابکەوێت، شیشەیەك یان دەخیلەیەکتان هەبێ هەموو شەو هەزار دیناری تێ بخەن، لە کۆتایی مانگ ئەم 30 هەزارە دەربێنن و بیخەنە ناو ژمارە حیسابێکی بانکی جودا، ئەم حیسابە دەبێتە پشتیوانەی دارایی تۆ، دەبێ ئەو حیسایە هیچ کات دەستکاری نەکرێت، ئەوە ئەو ژمارە حیسابەیە کە قەولە دەوڵەمەندت بکات، بەڵێنت پێ دەدەم کە ئەگەر بەم جۆرە کار بکەیت بەرهەمی دەبێت؛ تەنها 30 هەزار دینار لە مانگێك پاشەکەوت بکە، ئێستا بە هۆی ئەم 30 هەزارەو شتێکی زیادەمان دەستکەوت بەڵام ئایا دەتوانی ئەم کارە سادەیە ئەنجام بدەی؟ و باقی گوزەرانی ژیانت لە سەر 99٪ دیکە بەڕێوەبەری؟ ئەم 30 هەزارە کاریگەریەکی ئەوهای لە سەر ژیانی تۆ نییە، وایە؟ بۆنموونە ئەوەندە کافیە هەفتەی جارێك کەمتر بچیتە ڕێستۆرانت یان کافتریایەك، مەگەر دنیا خراپ دەبێ؟ زۆرباشە، کەوابوو ئەم پارەیەمان وەلانا بۆ پاشەکەوت و ئێستا ئەمە هەنگاوی یەکەمە ، بەڵام بۆ ئەوەی دلگەرم بیت لەبیرتان بێت هەتا

سەفەرە چەند هەزار کیلۆمەتریەکانیش هەر بە هەنگاوی یەکەم دەست پێ دەکات تۆ ئەم ڕێگەیەت تازە دەست پێ کردووە کە بیبڕی، کاتێك عادەتت بەم کارە کرد ئەوکات ئەو داهاتانەش کە لە ناکاو دێنە دەستت و چاوەڕێی نەبوویە ئەوانیش بخە ناو ئەم دەخیلەوە بۆنموونە کاتێك لە شوێنێك کار دەکەی و پاداشت وەردەگری یان هەندێ جار هەندێ کەل و پەلی دەرد نەخواردوو دەفرۆشی و خوولاسە ئەو پارانەی کە چاوەڕێی نەبوویە هەموویان بخە ناو ئەم دەخیلەوە، واتە هەموو ئەم پارانە دەیانخەیە ناو ئەم دەخیلە و لە کۆتای مانگ دەیخەیە سەر ژمارە حیسابەکەت، کەم کەم وەك ڕاکتۆری ئەتۆمی ئەم ژمارە حیسابە گەرم دەبێ و دەدرەوشێتەو پارەی زیاتر بۆ خۆی ڕادەکێشێ، لەم لا هەزار دینار لەولا پێنج هەزار دینار هەتا بۆ نموونە لە ڕۆژێکی بەفراوی کە سەرماو سۆڵەیە کەسێك سواری سەیارەکەت دەکی ئەویش بە زۆر پێنج هەزاری پێدای ئەو پارەیش بخە ناو دەخیلەکەوە، هەرچەند پارەکەت زیاتر و زیاتر دەبێ سەرچاوەی ووزەش زیاتر و زیاتر دەبێ بۆ جەزب کردنی پارەی زیاتر، ئەم پارەیە تەنها مانگی یەکەم 30هەزارە دڵنیابە مانگی دووەم و سێیەم بەرز دەبێتەوە بۆ 60 هەزار و 70 هەزار ئەوەندە لەم لاو لەولا پارەت بۆ دێ، کە لە کۆتای ساڵ ناکاتە360هەزار بەڵکو دەڕوا بۆ 500 هەزاریش.

بەڵام دەبێ بەردوام بی لە سەر زیاد کردنی پارە بۆ ئەم حیسابە، دەبێ ئەم پارەیە، ژمارە حیسای و دەفتەری خەرجیەکانت هەموو کۆنتڕۆڵ بکەی و ئەم پارەیەت خۆش بوێ و ڕێزی لێ بگری، دەبێ پێت وابێ کە ئەم پارەیە دەتوانێ بتخاتە سەر ڕێگەی گەشتن بە سەربەخۆیی دارایی، هەوەڵین ملیارد دیناری ژیانتان بە هەوەڵین سەد هەزار دینار دەست پێ دەکات، سەد هەزار دینار دەبێتە هەوەڵین ملیۆن دینار، دواتر دە ملیۆن دینار و باوەڕ بکە لە کۆتایی ساڵی دووەم دوو تا سێ ملیۆن پارەت دەبێ، بەڵام بەشی سەرەکی ئەم داستانە تازە دەستپێدەکات، تۆ کاتێك مەجبور دەبی بەو 99٪ ژیانت بگوزەرێنیت، ئەوکات زیرەکتر و مەنتقی تر دەبیت وەکوو ژمێریارێك ڕەفتار دەکەیت، لە ئەنجامدا هەر بەو برە پارەیە زۆر بە چاکی ژیانت بەڕێوە دەچێت و دەتوانی هەموو قەرزەکانیشت بدەیەوە و هەر لە خۆڕا بەیانەیەك لە خەو هەڵدەستی دەڵێی بۆ پاشەکەوتەکەم نەکەمە 2٪، بۆچی نا هەڵبەت کە دەتوانی، هیچ درەنگی لێ مەکەو دەست پێ بکە و دواتر دەبتە 3٪ و هەر ئەوها دەچێتە سەرێ.

هەدەفێك بۆ خۆت دیاری بکە، دەتوانم بە بوێریەوە بڵێم کە ئەگەر ئەوها بچێتە پێشێ لە ماوەی دوو ساڵ دەتوانی نزیك بیتەوە لە پاش کەوت کردنی 10٪ لە داهاتەکەت و بە پشت بەستن بە نەود دەرسەدەکەی دیکە ژیانت بەڕێوەبچێ، و لە هەمان کاتدا کەمتریش قەرزدار بیت، دەبیتە بەکارهێنەرێکی زۆر زیرەکتر و لە کارەکانت زۆر زۆر سەرکەوتوتر دەبیت، هەر ئەوەی کە ژمارە حیسابەکەت پارەی تێدا بێت هەست بە هێزێك دەکەیت و زیاتر متمانەت بە خۆت هەیە، هەندێك لەمەش تێ دەپەڕن و ئەوەندە ووردبین دەبن کە بۆ هەر خەرجیەك حسابێکی جودا دەکەنەوە، حسابێك بۆ خەرجی زانکۆ، حسابێك بۆ خەرجی سەفەر، یەکێك بۆ خەرجیەکانی ماڵەوە... ئاگات لێیە چۆن دەتوانی بەو نەود یان هەشتا دەرسەدەی داهاتەکەت دەتوانی بیگوزەرێنی و لە ماوەی سێ ساڵ چەند ملیۆن دیناریشت هەیە.

ماوەیەك لەمەوبەر، یەکێك لە هاوڕێکانم کە کەمێك شەرمنیش بوو، لە کۆتایی یەکێك لە سیمینارەکانم هاتە لام و ووتی برایان دەکرێ پێکەوە قسە بکەین؟

پێم ووت: هەڵبەت کە دەکرێ.

ووتی: برایان، من دەمهەوێ چیرۆکی ژیانی خۆمت بۆ باس بکەم، لەبەر ئەوەی پێم وابێ بۆت سەیر دەبێ. دەستی کرد بە گێڕانەوەی: من تەقریبەن بەر لە پێنج ساڵ لەمەوبەر لە یەکێك لە سیمینارەکانی تۆ بەشداریم کرد، تۆ لەبارەی پاشکەوت کردن و دیاری کردنی ئامانج قسەت دەکرد، من ئەو کاتە تەمەنم 35 ساڵ بوو، کرێچی بووم و دوو منداڵم هەبوو ئەو کاتە لە پێشانگایەکی سەیارەی دەستە دوو کارم دەکرد و سەیارەی دەستە دووم دەفرۆشت، زۆریش قەرزدار بووم، لە لوتکەی ئەو ســـەختیانە بوو کە بڕیارم دا کە هەمان ئەو 1٪ پاشـــەکەوت بکەم و ئامانجێکم بۆ خۆم دیاری کردو بە خۆمم ووت تا پێنج ســـاڵی دیکە هەموو قەرزەکانم دەدەمەوە و نەود ملیۆن دیناریش دەبێ پاشەکەوت بکەم و باوەڕم بە خۆم هەبوو کە بتوانم لە دوای پێنج ساڵ بە ئامانجەکەم بگەم، ئیتر دەست بەکار بووم و کەمێك فشارم بۆ خۆم هێنا، کەمێ پارەی زیاترم بەدەست هێناو و کەم کەم دەستم کرد بە پاشــەکەوت کردن و دانەوەی قەرزەکانم، و گرنگتر لەوە ئەوە بوو کە لە ماوەی دوو ســاڵ نیو نەود ملیۆن دینارم بەدەســـت هێنا بە هۆی پاشـــەکەوتەوە، یانی تەنها لە دوای دوو ســـاڵ ونیو نەود ملیۆن دینارم هەبوو، هیچ قەرزێکیشــم نەبوو، لەوەڕا کە پارە، پارە ڕادەکێشــێ، خاوەنی ئەو پێشــانگایەی کارم لێ دەکرد منی گۆاســتەوە بۆ پێشانگایەکی فرۆشتنی سەیاری نوێ و مووچەکەشم زیادی کرد، شەش مانگ دواتر واتە دوای سێ ساڵ لە کاری پاشەکەوت کردنم خاوەن پێشانگاکە پێی وتم بیستومە پارە پاشەکەوت دەکەی.

ووتم: بەڵێ

ووتی: دەتهەوێ لە کوێ سەرمایە گوزاری بکەیت؟

کوتم: ڕاستیەکەی لەم بارەوە کەمێ سترێسم هەیە لەبەر ئەوەی ئەم پارەیە لە ژمارە حیسابێکی تایبەتە ناوێرم دەستی بۆ ببەم.

پێی ووتم: لە پێشانگایەکی مەشهوری بەرهەم هێنەری سەیارە پێیان وتوم دەیانهەوێ بەشێکی نوێ لە ناحییەك بکەنەوە و دەیانهەوێ کەسێك بۆ ئەوێ دیاری بکەن و منیش پێشنیاری تۆم داوە.

ووتم: ئاخر من هیچ لە بارەی بەڕێوەبەری پێشانگاو ئەو شتانە نازانم.

ووتی: نیگەران مەبە من فێرت دەکەم، ئەگەر لەم کارە ســـەرمایەگوزاری بکەی من یارمەتیت دەدەم، ئەرشـــیڤی موشـــتەریەکان، و پێشـــینەی کارەکانیان هەموو دەخەمە بەردەســـتتو هاوکاریت دەکەم کە بتوانی ئەو بەشـــە بەڕێوەبەریت و چەند کارمەندێکی لێهاتوو و شارەزاش دەگوازمەوە بۆ ئەوێ.

دوای دوو تا سێ ساڵ پەیوەندی نێوانمان وەکوو دوو هاوکاری لێ هاتبوو، من موشتەریم بۆ ئەو دەنارد ئەویش بۆ منی دەنارد، لە ماوەی دوو ساڵ ئەوەندە پێشڕەویم کردبوو کە باوەڕم نەدەکرد و هەر چەند مانگ لەمەوبەر بوو کە توانیم بۆ خۆم پێشانگایەك بکڕم و ئێستا ملیاردێرم. ئێستا من یەك ملیاردێرم باوەڕ دەکەی؟

من پێنج ساڵ لەمەوبەر سەیارەی دەستە دووم دەفرۆشتەوە و ئێستاش ملیاردێرم، هەر بەو جۆرە کە دەڕۆشت لەبەر خۆیەوە دەیوت من یەك ملیاردێرم یك ملیاردێر. ئەم هاوڕێەی من عەینەکێکی زلی لە چــاو کردبوو و کە ڕوخسارێکی سـرنجڕاکێشیـشی نەبوو بەڵام یەك ملیاردێر بوو، ئەوەش تەنها لە دوای پێنج ساڵ کە هەدەفی خۆی دیاری کردبوو.



یاســای کۆکردنەوەی پارە وەکوو تۆپەڵە بەفر کە کاتێك لە بەرزایەکەوە گلۆر دەبێتە خوارێ لە خاڵێکی بچــوك دەســـت پێ دەکات و هەتا دێتە خوارێ بەفری زیاتر بۆ خۆی جەزب دەکات و تا دێت گەورەتر دەبێت، تەنها ئەوەندە پێویســـتە تۆپەڵە بەفرەکە بخەیتە جوڵەو چــاوەڕێی ئەنجامەکەی بە؛ ســـەیر ئەوەیە کە ئەم تۆپەڵە بەفرانە بە پتەیەك وە جوڵە دەکەون" تەنها هەزار دینار لە یەك ڕۆژ" تکایە تا ئەو کاتەی ئەم کارەتان تاقی نەکردۆتەوە مەڵێن هەزار دینار، هەموو شـــانس و دەرفەتە گەورەکان لەم خاڵەی ســـەرەتاوە دەســـت پێ دەکات؛ دەزانی گەورەترین هەڵە لە مەڕ پاشـەکەوت لەوانەیە بێتە پێش چیە؟ ئەوەی کە هەمیشـە وابیر دەکەیتەوە کە، باشە، هەروەخت پارەیەکی زۆرم دەست کەوت ئەو کات دەست دەکەم بە پاشەکەوت کردن، دڵنیا بە هەرگیز ئەو پارە زۆرەت دەسـت ناکەوێت تا پاشـەکەوتی بکەی، هەمیشـە بە پێچـەوانەوەیە ، ئەگەر هەر لە ئێسـتاوە دەسـت بکەی بە پاشەکەوت کردن پارەیەکی زۆرت دەست دەکەوێ.

**بێ: هەموو ملیاردێرەکان دە، یانزە و هەندێ جار بیست دەرسەدی داهاتەکانی خۆیان پاشەکەوت کردووە و بەم جۆرە دەوڵەمەند بوونە.**

**د: دینار بە دینار لە پارە زیادەکانت کۆ بکەوە حیسابی پشتیوانی خۆت بەهێز بکە، ئەم بابەتە خێراتر لەوە ڕوو دەدات کە بتوانی بیریشی لێ بکەیتەوە.**



**5: سوود لە دوو یاسای گەورەی سەروەت وەربگرە، ئەم دوو یاسایەنە ئەمانەن:**

**ئا: هەمیشــە کەڵك لە متمانەی پارەو ســوودی ســامانەکەت وەربگرە نەك خودی پارەکە، تۆ کە پارەت خســتۆتە شوێنێك بۆ نموونە بانك یان سەرمایگوزاری کردن ئەوا سوود لە دەستکەوتی پارەکەت وەربگرە، ئەو کات هەم لە بانك و هەم لە شوێنەکانی دیکەش متمانەت دەبێ بۆ کاری گەورەتر.**

**بێ: هەمیشە مام ناوەندی نرخی پارە لەبەرچاو بگرە، هەرگیز نیگەرانی بازاڕ و دابەزینی نرخی پارە مەبن: مام ناوەندی گرتن واتە بۆ نموونە ئەگەر دەتهەوێ لە ســەر کاڵایەك ســەرمایەگوزاری بکەیت و نرخی ئەو کاڵایە تا پێنج ساڵی دیکە دەبێتە دوو ئەوەندە ، پێویست ناکات تۆ هەموو پارەکەت یەکسەر هەر ئێستا بە کار بهێنیت بۆ کڕینی ئەو کاڵایە و یاخود بە پێچــەوانەوە پێنج ســاڵ زیاتر پاشــەکەوت بکە و بە پارەیەکی زیاتر کاڵاکە بکڕن. دەبێ بە درێژایی کات کاڵاکە بکرێت یانی مانگانە یان ساڵانە ئەو شتە بکڕە، بەم جۆرە نرخی کاڵاکە مام ناوەندی دەبێت یان دەبێتە دوو نرخ.**

**هاوڕێیەکم هەیە کە لە تەمەنی 17 ساڵی وەك پەناهەندە هات بۆ ئەمریکا، ساڵانی هەوەڵ زمانی ئینگلیزی باش نەدەزانی بەڵام هەر بەوەندە زمانەی کە دەیزانی دەستی کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکانی سەرکەوتووی دارایی لە ئەمریکا، کەم کەم بۆی دەرکەوت کە لەو سەردەمە کاری خانوبەرە (عقار) زۆر باشە و ئەگەر کەسێك بتوانێ بە چاکی ئەنجامی بدات سەرکەوتوو دەبێت، بەڵام ئەو تەنها خوێندکارێك بوو، پارەی پێویستی بۆ ئەم کارە نەبوو، تەنها لە کۆتایی هەفتان ئەویش دوانیوەڕۆیان کاری دەکرد بۆ ئەوەی خەرجی خوێندنەکەی بدات و لەو سەردەمە هەموو قوتابیەکان ئەو کارەیان دەکرد، بەڵام ئەو بڕیاری دا لە ماوەی ســاڵێك پارچــە زەویەك بکرێت؛ هەوەڵین موڵك کە کڕی نرخەکەی سێسەد دۆلار بوو، 300 دۆلار لەو کاتە پارەیەکی زۆر بوو، واتە مانگانە 25 دۆلار، بە کڕینی ئەم پارچــە زەویە بڕیاری دا هەر ســاڵێك پارچــە زەویەك بکڕێت، ئەوکات ئەو تەمەنی 20 ســاڵ بوو کە دەستی بەم کارە کرد بەڵام ئێستا تەمەنی 49 ساڵە، ئاخرین موڵکی کڕیویەتی شوێنێکی بازرگانیە کە نرخەکەی 212 ملیۆن دۆلارە و ماوەیەك لەمەوبەر بۆ نانی ئێوارە چــووبومە ماڵەکەی، بینیم خانویەکی چــوار تەبەقی هەبوو کە نزیکەی 1500 مەتر بوو، بە ملیۆنان دۆلاری خســـتۆتە کاری ســـەرمایەگوزاریەوە... و یەکێك لە دەولەمەندە زلەکانی ئەو شارە.، ئەو ئەگەر ئەو 25 دۆلارەی پاشـەکەوت نەکردبا نەیدەتوانی بگات بەم ئاسـتە و هەروەها ئەگەر ئەو تەنها پاشەکەوتی کردبا و ئەو زەویانەی نەکڕیبا نەیدەتوانی ئێستا هەموو ئەم شتانە بکڕێ، ئەمە واتە لە بەرچـاو گرتنی مام ناوەندی نرخی پارە، ئەو ئەو کەســە بوو تا تەمەنی 20 ســاڵی نەیدەتوانی بە چـــاکـی ئـــیـــنـــگـــلـــیســـی قســـە بـــکـــات، یـــەك پـــەنـــیشـــی لـــە گـــیرفـــانـــی نەبوو.**

**تۆ چــی بەهانەیەکت هەیە کە نەبیتە ملیاردێر، بەهانەی ئێمە چــیە، ســەدان، هەزاران و ملیۆنان نموونەی لەم جۆرە هەن، ئەی بەهانەی ئێمە چیە؟**



6: ئەوەڵین یاسا بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن دەست پێوەگرتنە (سەرفەجویی):

دەبێ ڕاهێنان بکەین لە سەر دەست پێوەگرتن، سێ یاسای سەرەکی هەیە بۆ سەرکەوتن لە کاری عقارات یان خانوبەرە کە بریتین لە: پێگە (مەوقعیەت)، پێگە و پێگە و سێ یاساش هەیە بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی کە ئەمانەن: دەست پێوە گرتن، دەست پێوە گرتن و دەست پێوە گرتن؛ ئەگەر بچوکترین گومانت بۆ دروست بوو مەیکڕە و خەرج مەکە، ئەگەر دەتوانی بە کرێی بگری مەیکڕە، ئەگەر دەتوانی بۆ کاتێکی دیاریکراو سوودی لێ وەرگری مەیکڕە، ئەگەر دەتهەوێ شتێك بە قەرز بکڕی ئەوا مەیکڕە.

دەست بە خەرجیەوە بگرە، دەست پێوە گرتن لە هەموو شتەکانی ژیانت، لە دەست پێوەگرتنی ئاو و کارەبا وخولاسە هەرشتێك پارەت بۆ دەگەڕێنێتەوە.

ئاوازی چۆلەکەت هەمیشە لەبیر بێ کە دەڵێ چیپ چیپ چیپ یانی هەرزان هەرزان؛ واتە بە قازانج و هەڵبەت چاك دەزانی کە دەست پێوەگرتن بە مەعنای قرنیسی و خەرج نەکردن نییە، هیچ کێشە نییە کە خەڵك نوکتەت لەسەر باس بکەن لەوەی چەندە دەست بە خەرجیەوە دەگری و پێ بکەنن، بەڵام کاتێ گەشتیە تەمەنی پەنجا ساڵی دەبینی هەمان ئەو کەسانەی بە تۆ پێ دەکەنین چۆن گرفتاری نەداری و قەرز و قۆڵە بوونەتەوەو هەرچی پارە هەیە خەرجیان کردووە و هیچ پشتیوانیەکی داراییان لە ژیانیان نییە.



7: ئارامت هەبێ:

بۆ ئەوەی دەوڵەمەند بی دەبێ دووربین بیت، لەبیرتان بێت کە یەك ملیاردێر بە شێوەی مام ناوەند بیست ساڵ درێژە دەکێشێ کە تا لە سفرەوە بگاتە یەك ملیار دینار و جاری وا هەیە زیاتریش کەوابوو دەبێ پشوودرێژ بین و کەم کەم پارەکان لەسەر یەك دابنێین، بە ئارامی بڕۆ پێش بەڵام بە بەردەوامی و بە بێ وەستان، پێویست ناکات کەسیش بزانێ کە تۆ پاشەکەوتت هەیە یان فلان بەرنامەت هەیە، ئەمەش تایبەتمەندیەکی دیکەی ملیاردێرەکانە ئەوەی کە هیچ کەس نازانێ ئەوان چەندیان پارە هەیە ، هەتا لە ڕووکەشیشیان ناتوانین بزانین داراییەکانیان چەندە، سواری سەیارەی ئاسایی و دەستە دوو دەبن، لە ناوچە ئاساییەکان دەژین نەك لە ناوچەی دەوڵەمەندەکان و خەڵك نازانن کە ئەوان دەوڵەمەندن هەندێ جاران منالەکانی خۆشیان.